دووەمینی ئەو سێ کەسانەش ( دافید لیۆن کۆهین ) ە کە جوولەکەیەکی فەرەنسی بوو و دەورێکی گرنگی گێڕا لە وروژاندنی هەستی بیری نەتەوایەتی لە دەروونی تورکەکان دا .

لە ساڵی (١٨٩٩) دا نووسەری ناوبراو کتێبێکی بەناوی ( تَعْريف عامّ بتأريخ آسيا ) بڵاوکردەوە کە لەوێ دا زۆر پێداگیری لەسەر بەرزی و چاکتری ڕەگەزی تورک کردووە ، زۆر بەو بەسەرهات و جەنگانەی هەڵگوتوە کە لە مێژووی پێش ئیسلامیان دا کردوویانن !!

وە کتێبی ناوبراو لە دەیەکانی سەدەی بیست دا وەرگێڕرایە سەر زمانی تورکی و بەشێوەیەکی زۆر بەربڵاو چاپ کراو پەخش کرا .

هەرکام لە پرۆفیسۆر (خدوری ) و ( برنارد لوبس ) یش بڕوایان وایە کە ( کۆهین ) ی جوولەکە بوو بیری نەتەوایەتی و تورکایەتی لەنێو ئەندامانی بزووتنەوەی ( تركيا الفتاة ) دا بڵاوکردەوە ، کە لە ساڵی (١٩٠٨) لە دژی خەلافەتی ئیسلامی شۆڕشیان بەرپاکرد .

سێیەمین کەسی جوولەکەش کە گەورەترین دەوری هەبوو لە بڵاوکردنەوەی بیری نەتەوایەتی لەنێو گەلی عارەب و تورک دا ، ڕۆژهەڵاتناسی ناسراو ( أرمینۆس فامبری ) کوڕی ( حاخام ) ی جوولەکانی ( مَجَر ) ە ، ئەم جوولەکەیەش وێڕای نووسینی چەند نووسراوی زۆر سەبارەت بە پێویستی بووژاندنەوەی نەتەوایەتی تورک ، چەندان جۆرە پەیوەندی پتەویشی لەگەڵ کاربەدەست و سیاسییە دەمڕاستەکانی تورک دا بەرپاکرد .

هەڵبەتە گەورەترین ئامانجی ئەورووپاش بەتایبەتی جوولەکەکان لە بڵاوکردنەوەی بیری تورکایەتی و عارەبایەتی دا پاش پارچەپارچە کردنی نیشتمانی ئیسلامی و پەرتەوازەکردنی مسوڵمانان بریتی بوو لە ڕێ خۆشکردن بۆ داگیرکردنی فەلەستین ، چونکە جوولەکەکان زۆریان هەوڵ دا کە بە ترس و تەماع سوڵتان ( عبدالحميد ) ئیقناع بکەن ،

که خاکی فەلەستینیان بداتێ بۆ جوولەکە کۆچکەرەکان ، بەڵام ئەو بە وەڵامێکی ددان شکێن و بڕیا رێکی گرچووبڕ تەما برا وی کردن ، جا پاش ئەوەی هەڵوێستی مەردانەی سوڵطان ( عبدالحمید ) بیـــان دی ، زانیان کە تاقە ڕێ ی گەیشتن بە زەوت کردنی خاکی فەلەستیـــن ، بریتیە لە لەنێوبردنی خەلافەتی ئیسلامی بەهۆی لێخستنی سوڵطـــان ( عبدالحمید ) ەوە !!

هەڵبەتە زۆر بەداخەوە کە هەوڵ و پیلانەکەشیان سەری گـــرت و بزووتنەوەی طۆرانی بەناوی ( ترکیا الفتاة ) پێک هات و ، لـــە ساڵی (١٩٠٨) دا سوڵطان ( عبدالحمید ) ی لێ خست و لە کۆشکـــی خەلافەتێ دەری کرد !!

ئنجا دوای ئەوەی تورکەکان ئاڵای نەتەوایەتی‌یان بەرزکردەوەو درووشمی تورکایەتی‌یان هەلگرت و کەوتنە دژایەتی کردن لەگـــەڵ عارەب و کوردو باقی گەلانی دیکەی پێکهێنەری ئۆممەتی ئیسلامی دا ، ئەو گەلانەش بەتایبەتی عارەب لە بەرانبەردا کاردانەوە (رد فعل)ی خۆیان پێشان داو کەوتنە بیری دژایەتی کردنی تورکان و داواکردنی سەربەخۆیی‌و جیابوونەوە لە دەوڵەتی خەلافەتی ئیسلامی !!

بێگومان بەمەش ئیمپریالیزمی جیهانخۆر بە بەردێک سێ چـوار چۆیلەکەی کوشتن و ئاواتی پیسی لەمێژینەی خۆی هێنایەدی .

هەڵبەتە نابێ ئەوەشمان لە یاد بچێ کە ئەوکەسەی جوولەکـان فوویان تێ کردو کردیانە فسۆس پاڵەوانی تورکیاو تورکایەتـــی‌و ، ڕووخانی خەلافەتی ئیسلامی ڕاگەیاند ، بریتی بوو لە ( کەمــــال ئەتاتۆرک ) !!

ئنجا سێیەمین ناوچە لەدوای میسرو تورکیا کە ئیمپریالیزمـــی ڕۆژئاوا و سەهیۆنیزمی جیهانی ڕەچاویان کردبوو بۆ تێـــــــدا بڵاوکردنەوەو ڕەواج پێدانی بیری نەتەوایەتی ، بریتی بوو لــــە

سووریا و لوبنان و ئەردەن، چونکە لەو سەروحەدەی دا بزووتنەوەو دام و دەزگاکانی بە مەسیحی کردن ( التَبْشِيْر ) لە چلەپۆپەی چالاکی یان دا بوون، ئاخر مەسیحی یە کاثۆلیکی یەکان لە سالی (۱۸۳۰) دا چووبوونە شام، بەلام پرۆتستانتەکان لە سالی (۱۸۲۰) دا خۆیان گەیاندبۆیە !!

ناوداترین کەسیش کە دەورێکی بەرچاوو بالای هەبوو لە پەرەپێدانی بیری نەتەوایەتی دا لەو ناوچانەدا ( نجیب عازوری ) بوو کە بە دامەزرێنەری بیری نەتەوایەتی عارەبی دادەنرێ و کرێ گرتە ( عمیل ) ی هەرکام لە ئینگلیزو فەرەنساش بوو !

( نجیب عازوری ) لە سالی ۱۹۰۴ دا کتێبێکی بەناوی ( يَقظَةُ الشَعْبِ العَرَبِيّ ) بلاوکردەوە، ئنجا کۆمەلێکی دامەزراند بەناوی ( إتّحاد الوَطَنِ العَرَبيّ ) وە گۆڤارێکی بەناوی کۆمەلە ( جَمْعِيَّةَ ) بلاوکردەوە بەناوی ( إستقلالُ العَرَب ) !

وە یەکێک لەو مەبەستانەی گۆڤاری ناوبراو زۆر داکۆکی لەسەر کردوەو دووپاتی دەکردەوە ئەوەبوو کە ( عارەب ) ڕەگەزێکی سەربەخۆو جودان لە ڕەگەزی تورک و، عارەب لە ڕەگەزێکی هەلبژاردەن و لە هەموو گەلانی دیکە چاکترو پەسندترن .

وە ( عازوری ) بڕوای وابوو کە بۆ ڕووخاندنی ئیمپراطۆری عوسمانی دەبێ سێ شۆڕش بکرێن :

شۆڕشێکی عارەبی و شۆڕشێکی کوردی و شۆڕشێکی ئەرمەنی !!

ئنجا دەبی ئەوەش بگوترێ کە ( نجیب عازوری ) بە ئاشکرا وەفای خۆی و وابەستەیی خۆی بەرانبەر بە ئیمپریالیزمی ئینگلیزی و فەرەنسی پێشان دەداو دەری دەبڕی کە ئامادەیە بە پشتیوانی ئینگلیزو فەرەنسا لە دژی ئیمپراطۆری عوسمانی شۆڕش بەرپا بکات .

هەلبەتە جگە لە ( نجیب عازوری ) چەند کەسێکی دیکەش دەورێکی

گرنگیان گێڕا لە ڕەواجپێدانی بیری نەتەوایەتیو عارەبایەتی لەنێو عارەبەکان دا، وەک ( بُطْرُس بُستانی ) و ( ناصِیف یازَجی ) و ( ابراهیم یازَجی ) و ( نوفل نوفل ) و ( میخائیل شحادة ) و ( جَرجیْس فَیّاض ) .

بەڵام ئەوەی کە لەنێوان جەنگی جیهانی یەکەم و دووەم دا گەورەترین دەوری هەبوو لە پەرەپێدان و درەوشاندنەوەی بیری ڕەگەزپەرستیو عارەبایەتیدا ( ساطع الحصری ) بوو، کە ماوەیەک وەزیری مەعاریف بوو لە سووریاو ماوەیەک ( مُدَرِّس ) بوو لە ( مَعْهَدُ التَّربیةِ العالي) لە قاهیرەو، سەردەمێکیش ( مدیر عام المعارف ) بوو لە عێراق !!

وە شایانی باسە کە ( ساطع الحصری ) ماوەی (٢٠) ساڵێک پتر لە خزمەتی ئینگلیزدا بوو لە عێراق دا، لەماوەی حوکمی هەرکام لە ( المَلِكُ فَیْصَل /١٩٢١-١٩٣٣) و ( الملک غازي /١٩٣٣-١٩٣٩) و دوو ساڵ لە سەردەمی نوری سعیدو ( وصایة الأمیر عبدالأله ) !!

ئنجا ئەوەی کە هەوڵ و تەقەللاو پیلان و تەڵەکەی ئەو ڕەگەزپەرست و ناسیۆنالیستانەی درێژە پێ داو، درەختی بەدو شوومی عارەبایەتی وەبەرهێناو، تاجی واقیعیەت پێ بەخشینی لە سەری نەتەوەپەرستی نا، بەڕواڵەت فەلەی لەڕاستیدا جوولەکەی فرچک گرتووبە شیری گوانی ئیمپریالیزمی جیهانییەوە ( میشیل عفلق) ی گاور بوو !

ئەو میشیل عەفلەقەی کە حیزبێکی شەیتانی دامەزراند لە ساڵی ١٩٤٧ زدا بەناوی ( حزب البعث العربي الأُشتراکي ) .

ئێستاش بەپێویستی دەزانم کە لە باسێکی سەربەخۆدا ماهیەتی حیزبی بەعس بە خوێنەر بناسێنین، چونکە لەم سەردەمەدا حیزبی گۆڕین بۆتە نوێنەرو موجەسسەمەی بیری ڕەگەزپەرستیو نەتەوایەتی لەنیو عارەبەکان دا .(١)

---

(١) بۆ نووسینی ئەو پێنج باسانەی کە ڕابردن سوودم لەم سەرچاوانە ←

وەرگرتوە :

١ـ ( كيف هدمت الخلافة؟) عبدالقديم زَلُّوم .
٢ـ ( الحلول المستوردة ) د. يوسف القرضاوى .
٣ـ ( فكرة القوميه العربيه على ضوء الاسلام) صالح بن عبدالله العبود .
٤ـ ( الاسلام والقومية ) د. على محمد نقوى .
٥ـ ( الفكر القومي اسلامياً وتاريخياً ) نجاح عطا الطائى .
٦ـ ( اسلام وناسيوناليزم) أبو الأعلى المودودى .

# پێناسەی حیزبی بەعسی عارەبی سۆشیالیست

ئەم حیزبە لە سەرەتای چلەکان دا سەری هەڵداو یەکەمین کۆنگرەی دامەزراندنی لە ساڵی (١٩٤٧) دا گیرا[1]، وەک پێشتریش گوتمان دامەزرێنەری ئەم حیزبە میشیل عەفلەقی گاورە .

جا ئەوە لە چەند خاڵێکی گوشراوو کورت دا هەوڵ دەدەین حیزبی ناوبراو پێناسە بکەین و دەمامکی سەر ڕووی لابدەین :

یەکەم : حیزبی بەعس لەسەر دوو ڕەگی ناسیۆنالیزم و سۆسیالیزم ، یان نەتەوەپەرستیو ماددەپەرستی بنیات نراوە ، ئەمەش هەر لە خودی ناوو نیشانەکەی دا دەردەکەوێ ، ( حزب البعث العربی الأشتراكي ) .

بەڵێ ( حیزبی بەعس ) ناوی ئەو کۆمەڵە خەڵکەیە کە میشیل عەفلەق خڕی کردوونەوە ،وە ( العربی الأشتراكي ) دوو وشەن نێوەڕۆک و ماهیەتی بیروباوەڕی ئەو حیزبە دەخەنەڕوو .

دووەم : حیزبی بەعس دژی ئیسلامە ، چونکە خودا فەرموویەتی : ( اِنَّ الدِّيْنَ عِنْدَ اللّٰهِ الأسلام ) آل عمران /١٩ . واتە :

بەرنامە لای خوا بەس ئیسلامە . وە فەرموویەتی : ( وَمَنْ يَبْتَغِ غَيْرَ الأِسلام دِيْناً فَلَنْ يُقبَلَ مِنْهُ .. ) آل عمران / ٨٥ . واتە :

وە هەرکەسێک جگە لە ئیسلام بەرنامەیەکی دیکە بخوازێ لێی وەرناگیرێ ..

دیارە جگە لە ئیسلامیش کە بەرنامەی هەڵبژاردەی خودایە

---

(١) بڕوانە ( عُروبةُ الأسلامِ وعالميَّتهُ ) شبلي العَيْسَمي / ص ٢٣٧ .

( وَرَضيتُ لَكُم الأسْلامَ ديناً .. ) المائدة/٣ . هەموو بەرنامەو بیردوزەیەکی دیکە بە هەڵەو ناهەق دادەنرێ، چونکە ( فماذا بَعْدَ الحقِّ إلاّ الضلال .. ) یونس/٣٢ .

دەجا ئاشکراشە کە حیزبی بەعس بە ڕاشکاوی و بێ پەردە خۆی پاڵداوەتە لای عارەبایەتیو سۆسیالیزم ( العربي الأشتراكي ) و هیچ حیسابێکی بۆ ئیسلام نەکردوە !!

سێیەم: دان پێداهێنانی سەرانی حیزبی بەعس بە دژایەتی یان سەبارەت بە ئیسلام :

لەڕاستیدا ئەگەر بمانەوێ هەموو ئەو پێ لێنان و دان پێدا هێنانانەی سەران و دەمڕاستانی حیزبی بەعس سەبارەت بە بڕوانەبوونیان بە ئیسلامو دوژمنایەتی کردنیان دەربارەی، بخەینەڕوو پێویستە دەیان لاپەڕە پڕبکەینەوە، بەڵام بەدەردی پێشینان دەڵێن :( لوبێچێک نموونەی تەغارێکە ) ، ئەوا ئێمەش چەند دەقێک بە نموونە دێنینەوە :

یەک : ( میشیل عفلق ) دەڵێ: ( .. إنّ الأستعمارَ والاقطاع والرجعيةَ الدينيةَ بمحاولتها هذه تهدف إلىٰ إجهاض جنين الثورةَ النامي في أحشاء شعبنا .. ) (١) واتە :

بێگومان ئیمپریالیزمو دەرەبەگایەتیو کۆنەپەرستی ئایینی بەم هەوڵدانەی دەیەوێ کە کۆرپەی شۆڕشی پێگەیشتوو لەنێو هەناوی گەلەکەماندا لەبار ببچوێنێ ..

دوو: ( ناجي علوش ) کە یەکێکە لە سەرانی حیزبی گۆرین گوتوویەتی: ( ان البعثيين مؤمنون بفصل الدين عن الدولة، التي يجب ان تكون علمانيةً ) (٢) واتە :

---

(١) ( بيان البعث ) القطر العراقي/ كانون الاول / ١٩٦١ .
(٢) ( الثورة والجماهير ) ناجي علوش / ص ١٥٨ .

بێگومان بەعسییەکان بڕوایان بە لێک پچڕاندنی ئایین و دەوڵەت هەیە، دەڵێن دەبێ دەوڵەت ( عیلمانی) بێ .

سێ: ( منيف الرزاز) یش کە یەکێ دیکەیە لە دەمڕاستانی حیزبی بەعس گوتوویەتی: ( الحَرَكَةُ القَوْميَّةُ الأشتراكيَّةُ هِيَ المَرْحَلةُ الرّابِعَةُ مِن مَراحِلِ تَطَوّرِ الحَركةِ القَوميَّةِ ونَضْجِها ، فَبَعْدَ أَنْ مَرّتْ هذهِ الحَرَكَةُ بِمَرْحَلةِ رَدِّ الفِعْلِ الفِطْرِيِّ ثُمَّ مَرْحَلةِ الأصلاحِ الدّيني فَمَرْحَلةِ الوطَنيَّةِ البرجوازيةِ الليبرالية كان حَتماً أَنْ تَنْتَهِيَ الى مَرْحَلةِ القَوْميَّةِ الأشتراكيّة ) . (١)

چوار: ( صدام حسين ) یش " شەرعی خوا" بە شتێک و قالبێکی بەستوو و نەگونجاو دەزانێ و، لەو بارەوە دەڵێ: ( .. الفِقْهُ الأسلاميُّ فِقْهٌ رَجْعِيٌّ مُتَحَجِّرٌ وجامِدٌ لايَتَوافَقُ مع مُتَطلباتِ العَصْرِ، نَحْنُ لانَنسَخُ ولانَستَنسِخُ مِنَ الماضِي، نَحنُ لانُريدُ مِنَ الدَّولةِ أو الحِزبِ أَنْ يَطَّبِقَ التَّعاليمَ الدينيَّةَ في دائرتِهِ، لأن ذلك يؤدّي إلى التفرقةِ الطائفيةِ وبذلكَ نَخسرُ شَعبَنا ، ونُريدُ من رَجُلِ الدّينِ أَنْ لايتدخَّلَ في شؤونِ الدَّولةِ.. ) (٢)

بەڵێ ( صدام حسين ) دەڵێ شەرعی ئیسلامی هیچی بەکەڵکی ژیان نایەت و، ئەگەر وەدوای بەرنامەی خوا بکەوین خەڵکمان لەقیس دەچێ!

بەڵام زانایان هەموویان لەسەر ئەوە ڕێک کەوتوون کە کەسێک بڵێ: ( یەک یاسای ) ئیسلام بەکەڵک نایەت کافر دەبێ !!

پێنج: ( الياس فرح) یش کە یەکێ دیکەیە لە زلەزلانی بەعس دەڵێ: ( إنَّ نَظْرةَ حِزبِ البَعْثِ لِلحياةِ ولِلدّولَةِ هِيَ نَظْرةٌ عِلْمِيَّةٌ ومَنهجيَّةٌ لاتؤمِنُ بالفِكْرِ الغَيْبِيِّ ) (٣).

---

(١) ( فلسفة الحركة القومية العربية ) منيف الرزاز/ ص ٩٤ .
(٢) ( نظرة فى الدين والتراث ) صدام حسين .
(٣) بڕوانە ( الفكر القومي اسلامياً وتاريخياً ) ص ١٧٨ .

شەش: لە یەکێک لە نامیلکەکانی ( میشیل عفلق ) دا بە شێوەی پرسیار ڕوو لە ( عفلق ) کراوەو گوتراوە: ( لقد أكّد الرّفيق القائدُ المؤسّس في أكثر من مناسبة على الرّوح .. رغم أنّ فكرنا الثوريّ يعتمدُ العلمية ورفضَ الجانبَ الغيبيّ .. ) . (١)

حەوت: لە یەکێک لە نامیلکەکانی حیزبی بەعس دا گوتراوە:
( لَمْ يتناولْ فكرُ حزبِ البعثِ العربيّ الأشتراكيّ الدّينَ مِنْ حيثُ هُوَ نَظْرةٌ الى ما وراءَ الطّبيعة .. ) . (٢)

هەشت: ( شبلي العيسمي ) کە یەکێ دیکەیە لە ڕابەرانی حیزبی بەعسی کافر دەڵێ: (٣)
( وراح رجالُ الدّين المتعصّبون يعتبرونَ الدّينَ هُوَ البديلَ المنشودَ ومادامَ هؤلاءِ يرَوْنَ في الأسلام ديناً ودنياً وفيه العلاجُ الشافي والكافي لكلّ ماتعانيه الأمّةُ من أمراض ومشكلاتٍ في شتّى ميادينِ الحياة، فقد أخذوا يبشّرون النّاسَ بأقامةِ الدّولة على أساسِ الأسلام وتعاليمِه ؟! ) .

کاکڵەی قسان:

یەک: حیزبی بەعس حیزبێکی کافرە لەسەر بنچینەی ڕەگەزپەرستی و سۆسیالیزم و ماددەپەرستی دامەزراوە .

دوو: حیزبی بەعس وەک کەلەپوورێکی نەتەوەیی دەڕوانێتە ئیسلام و بڕوای بە نادیار ( غيب ) نیە .

سێ: حیزبی بەعس ئیسلامەتی بە کۆنەپەرستی لەقەڵەم دەدات و، کاڵتە بەوانە دەکات کە دەڵێن دەبێ دەوڵەت لەسەر بنچینەی ئیسلام

---

(١) ( البعث والتراث ) ميشيل عفلق / ص ٦٠ .
(٢) ( سلسلة الثقافة الثورية في العقيدة العربية الثورية ) ص ٤٢ ، العدد / ٢٠ .
(٣) ( عروبة الأسلام وعالميته ) شبلي العيسمي ص ١٠ .

دابمەزرێ .

چوار: حیزبی بەعس شەرعی ئیسلامی بە کۆن و ئیشک و بەکەڵک نەهاتوو لەقەڵەم دەدات .

پێنج: حیزبی بەعس دەڵێ نابێ زانای ئاینی دەست لە کاروبـــاری دەوڵەت وەربدات .

شەش : حیزبی بەعس پێی وایە بەهۆی بەڕێوەبردنی بەرنامەی خـــواوە خەڵک پارچەپارچە دەبێ و پەرتەوازە دەبێ .

حەوت: حیزبی بەعس وەک مارکسیزم بڕوای وایە کە دوابیین قۆناغـــی گەشەکردن و گۆڕانی کۆمەڵ سۆسیالیزمە .

خوێنەری بەڕێزم !

ئەمەی ڕابرد کورتەیەکی زۆر ڕاپازنەراو بوو لە پێناســـەی حیزبی بەعسی کافر لەبەر تیشکی بیروراو پی لیفانی ســـەرکردەو ڕابەرانیدا ، بەڵام ئەگەر بێت و ئەو حیزبە کافرە لەبەر تیشکـــی پەرێزو شوێنەواری شووم و بێ خێرو هەڵوێستە دڕندانەو داخ لـــە دڵەکانیدا پێناسە بکەین کە کارەساتی کاول کردنی کوردستـــان و قەتڵ عام کردنی خەڵکی مسولمانی کوردو وێرانکردنی شـــاری (حەما) و کوشتنی نیزیکەی (٤٠٠٠٠) کەس لە دانیشتووانـــی و، بوردومان کردن و کیمیابی باران کردنی شاری هەڵەبجەو کوشتنـــی زیاتر لە (٥٠٠٠) کەس لە دانیشتووانیو، کیمیابی ڕشێن کردنـــی دێ یەکانی بادینان و ناوچەی خۆشناوەتیو ... هتد وە لەسێدارەدانی چەندان زانای وەک : عبدالعزیز البَدْري و شیخ عارف البَصْـــريو محمد باقر الصَّدرو بِنتُ الهُدیو ، حەپس کردن و دەرکردن و لەسێدارە دان و ئەشکەنجەدانی هەزاران کەس لە ژن و پیاوو پیرو گەنجـــی کوردو عارەب لە عێراق و سوریادا و، شەڕفرۆشتن بە کۆماری ئیسلامی ئێران و، داخستنی حوجرەو قوتابخانە ئیسلامییەکان و، ڕووخاندنـــی

مزگەوتەکان و قەدەغەکردنی چاپکردن و هێنران (استیراد)ی کتێبە ئیسلامییەکان و، پەرەپێدانی داوێن پیسیو مەیخۆریو سوودو قومارو جاسووسیو جاشەتیو ڕێگریو دزیو کوشتارو، قەدەغەکردنی بەرگ و پۆشاکی ئیسلامییانەی ئافرەتان و، سەربارەش کوشتن و بریندارکردنی هەزاران کەس لە مسوڵمانانی دانیشتووی ئێران بەهۆی بوردومانی فڕۆکەو تۆپ و ڕۆکێت هەڵدانییەوە .. چەند دیمەن و تابلۆیەکی زەقی ئەو حیزبە کافرو ڕەگەزپەرست و خاچپەرست و ماددەپەرستەن(1)!!

هەڵبەتە لێرەشدا زۆر بە ڕوونی ماهیەت و بیچمی حیزبی بەعسی عەفلەقی وابەستە بە خاچپەرست و سەهیۆنیزم و کۆمۆنیزمی جیهانی ، دەرکەوت کە بە پشتیوانی خوای بەتوانا وەک سەگی هار کەوتۆتە چل ڕۆژەی کۆتایی تەمەنی شوومییەوە.

ئێمەش کۆتایی بەم باسەش دێنین و دەچینە سەروکاری باسێکی دیکە .



---

(1) جێی سەرسوڕمان ئەوەیە کە کەسانێکی خۆبەزانازان هەبن دوودڵ و گوماندار بن سەبارەت بەوەی داخوا حیزبی بەعسی عەفلەقی کافرە ، یان ئایا میشیل عفلق و صدام و سەرانی دیکەی ئەو حیزبە کافرو دژ بە ئیسلامە کافرن یان نا ؟! لێرەدا لەئاقار ئەو جۆرە کەسانەدا هەر ئەوەم لەدەست دێ بڵێم: (انا لله وانا اليه راجعون) او (خوا عەقڵ بداتە منداڵتان) و هیچ کەس نەبێ بە حاڵتان !!

# بابی حەوتەم

# مەسەلەی کورد چی یەو، چۆن دەبەچی چارەسەر دەکرێ ؟!

گەلی کورد یەکێکە لەو گەلە سەرەکییانەی بە هەموویان ئۆممەتی ئیسلامی پێک دێنن ، ماوەیەکی زۆرە لەبن باری ستەمو چەوساندنەوەو دەستدرێژی کرانە سەردا دەناڵێنێ، وە لەڕاستیدا ستەمدیدەیی‌و چەوساوەیی‌و بێ قەوارەیی نەتەوەی کورد بە ئاڵۆزترین و گرنگترین مەسەلەی جیهان بەگشتی‌و ڕۆژهەڵاتی نێوەڕاست بەتایبەتی دادەنرێ !

جا ئایا حەقیقەت و نێوەڕۆکی ئەو مەسەلە گرنگە چی‌یەو چۆن و بەچیش چارەسەر دەکرێ ؟!

خوا پشتیوان بێ لەم باسەدا هەوڵ دەدەین وەڵامێکی ئیسلامی‌یانەی ڕاست و دروستی هەرکام لەم سێ پرسیارە بدەینەوە :

یەکەم: مەسەلەی کورد چی یە ؟!

پێشەکی دەڵێین :

هەتا مسوڵمانانی جیهانی ئیسلامی بە تێکڕایی پابەندی ئیسلام بوون و درووشم‌و ئاڵای ئیسلامیان هەڵگرتبوو، کێشەیەک بەناوی ( کێشەی کورد ) لە نیشتمانی ئیسلامی‌دا نەبوو، بەڵکو کوردو عارەب و تورک و فارس‌و باقی گەل و نەتەوەکانی دیکە، بە برایەتی‌و تەبایی پێکەوە دەزیان و، بەهەموویان خزمەتی ئیسلامیان دەکرد،وە هەروەک چۆن عارەبێک و تورکێک مافی بیروڕا دەربڕین و کاروبار هەڵسووڕاندنیان هەبوو، کوردێکیش بەهەمان شێوەو بێ جیاوازی ، باشترین بەڵگەش بۆ سەلماندنی ڕاستیی ئەم قسەیەمان ، ئەوەیە کە

جیهانی ئیسلامی لە سەدەی شەشەمی کۆچیدا بە تورک و عارەب و نەتەوەکانی دیکەشەوە، بە سەرکردایەتی کوردی مەرد سوڵتان ( صلاح الدین ) ی ئەییوبی ڕازی بوون، کە سەرۆکایەتی بەهێزترین و گەورەترین دەوڵەتی ئیسلامی ئەوکاتەو سەرکردایەتی سوپای ئیسلام بکات و، سەری ئیسلام بە کوردو شی کورد بە ئیسلام بەرزبکاتەوەو، پاشەکشە بە سوپاو قۆشەنی خاچپەرستان بکات و رووی جیهانی ئیسلامی سپی بکاتەوەو قودسی پیرۆز لە چەنگاڵی پیسی ئەورووپی‌یە خاچپەرستەکان ڕزگار بکات!

دیارە ئەوسەردەمە گەلی ( کورد ) وەک هەر ئەندامێکی دیکەی ئەو ئۆممەتە ئیسلامی‌یە مافی تەواوی پارێزراوبووە، دەنا ئەوەتا ئێستاش کورد هەر هەن و گەلێک لە جاران پتریشن، بەڵام نەک هەر ڕێگەی بوونە سەرقافلەو براگەورەیەتی‌یان نیە، بگرە سادەترین مافی سروشتی‌و ئینسانیشی پێ ڕەوا نابینن!! کە بریتیە لە ژیان و گوزەران لە خاک و ئاوی خواپێداوی خۆی دا!

لەمەوە گەیشتینە ڕاستی‌یەکی گرنگ کە وەڵامی پرسیاری ( مەسەلەی کورد چی‌یە ؟) شە!

ڕاستی‌یەکەش ئەوەیە کە دوای سست بوونی پەیوەندی برایەتی ئیسلامی‌و بڵاوبوونەوەی گەرای پیسی ( ناسیۆنالیزم ) و ڕەگەزپەرستی ( العنصریة ) لەنێو جیهانی ئیسلامی‌دا، گەلە ئیسلامی‌یەکان بەگشتی‌و تورک و عارەب و فارس بەتایبەتی برایەتی ئیسلامی‌یان پێکەوە پچڕاندو بە پیلان و نەخشەی گڵاوی هێزە زلە ستەمکارو بێ ویژدان و خوانەناسەکان کەوتنە نێو تەڵەو داوی سیاسەتی پەرتکەو زاڵبە ( فرق تسد ) ی ئیمپریالیزمەوەو، عارەب ئاڵای عارەبایەتی‌و تورک ئی تورکایەتی‌و فارس ئی فارسایەتی‌یان هەڵگرت و، بە لاساکردنەوەی کوێرانەی ئیمپریالیزمی جیهانخۆر کەوتنە داپەڵۆسین و چەپۆک

پێدادانی گەلی بێ کەس و دڵسافی کوردی دراوسێیان[1]، دیارە لەحاڵێکی واش دا گەلی کوردیش بەپێی یاسای سروشتی (لەسەرخۆ ـ کردنەوە) کەوتە جموجۆڵ و پەلەقاژە بۆ وەدەست هێنانی ئازادی و سەربەخۆیی، بەڵکو بگرە بەس بۆ خۆدەرباز کردن لە لەنێوچوون و تواندنەوە !!

---

# دابەشکردنی کوردستان

دەربارەی چۆنیەتی زەوتکران و دابەشکرانی کوردستان

.. هەر لە سەرەتای سەدەکانی نێوەڕاستەوە کوردستان لەنێوان ئێران و ئیمپراطۆری عوسمانیدا دابەشکرا، لە سەدەی شازدەیەمەوە سولتان سەلیمی عوسمانی بەشی ڕۆژئاوای کوردستان و، شا ئیسماعیلی صەفەوی بەشی ڕۆژهەلاتیان بۆخۆ دابڕی !

پاشان لە سەرەتای سەدەی نۆزدەیەمەوە لە ئەنجامی کزی و بێ هێزی دەوڵەتی عوسمانی‌یەوە بەشێک لە خاکی کوردستان کەوتە ژێر دەستی ڕووسیا، ئنجا لەپاش جەنگی جیهانی یەکەم (١٩١٤ ـ ١٩١٨) ەوە کوردستان بەم شێوەیەی ئێستای بەسەر ئێران و عێراق و تورکیا و سووریادا دابەشکرا، وەک خاوەنی ئەسڵی کوردستان فارس و عارەب و تورک بن و (کورد) هیچ هەقێکی پێیەوە نەبێ !!

ئەمەی ڕابرد کورتەی هەواڵی چۆنیەتی دابەشکرانی کوردستان بوو، ئەمجار با نۆرەی درێژەی ئەو هەواڵە تاڵ و جەرگ بڕو نائیسلامی و بێ ویژدانانەیە بێت:

.. گەورەترین هۆی هەڵگیرسانی جەنگی جیهانی یەکەم بریتی بوو لە تەماعکاری و چاوچنۆکی دەوڵەتە زلەکان بۆ بەسەرخودا دابەش کردنی جیهان !

تێکرای ئەو دەوڵەتە زلانەش وەک کتکی برسی چاویان دەخاکی ئیمپراطۆری عوسمانی بڕیبوو و بەپەرۆشەوە چاوەڕێی میراتەکەی بوون !

تەنانەت ئەڵمانیای هاوپەیمان (حلیف) ی تورکیاش لە دەوڵەتە زلە هاوپەیمانەکان کەمتر بەهەویا میراتی هاوپەیمانەکەیەوە نەبوو !

لەبەر ئەوە هێزە زلەکان بە جیاجیا و بە کۆمەڵ مقۆمقۆیان

.............................................................

بوو و سەرگەرمی دانانی نەخشەو پیلانێک بوون بۆ هێنانەدی ئەو ئامانجەیان کە هۆی هەڵگیرساندنی جەنگیش بوو.

جا بێگومان کوردستانیش وەک بەشێک لەو میراتەو پارچەیەک لە خاکی دەوڵەتی عوسمانی، کە ئەوکاتە ناویان لێ نابوو پیاوە نەخۆشەکە (الرجل المریض)، شوێنێکی بەرچاوی هەبوو لەو نەخشەو پیلانە گڵاوەدا.

ئنجا پاش مشت ومڕو بگرەو بەردەیەکی زۆر دەوڵەتە هاوپەیمانە ـ کان (الحلفاء) بەشێوەیەکی نهێنی لەسەر دابەش کردنی ئیمپراطۆری عوسمانی رێک کەوتن، دیارە ئەو رێک کەوتنەش نەک هەر بەبێ ئاگاداری گەلانی ئەو ناوچانە بوو، بەڵکو لەسەر حیسابی دوارۆژیشیان بوو!

ئەو رێک کەوتن و پەیمانەی دەوڵەتە زلەکانیش کە لە مێژوودا بە پەیمانی (سایکس پیکۆ) ناسراوە، بە چەند قۆناغێک دا تێپەری:

سەرەتا لە رۆژی (١٩) ی مارتی ساڵی (١٩١٦) زدا لەنێوان بەریتانیاو فەرەنسادا گفت وگۆ دەستی پێ کرد، نوێنەری بەریتانیا (مارک سایکس) و نوێنەری فەرەنساش (جۆرج پیکۆ) بوو، پاشان هەموو ئەنجامەکانی گفت وگۆی بەریتانیاو فەرەنسا خرانە بەرچاوی رووسیا.

رووسیاش دوای بێنەوبەرەو مشت ومڕێکی زۆر قایل بوو کە پەیمانی گۆرین مۆر بکات.

دوایی لە رۆژی (٢٦) ی نیسانی ساڵی (١٩١٦) زدا فەرەنساو رووسیا رێک کەوتنێکی تایبەتی یان دەربارەی دابەش کردنی ناوچە ئاسیایی یەکانی ئیمپراطۆری عوسمانی یەوە مۆرکرد.

دوای ماوەیەکی کەم بەریتانیاش رەزامەندی خۆی بەرانبەر بەو رێک کەوتنەی هاوپەیمانەکانی پێشان دا.

.. لە رۆژانی (٩) و (١٦) ی مایسی هەمان ساڵ دا رێک ـ کەوتنێکی دیکەی لەو جۆرە لەنێوان بەریتانیاو فەرەنساش دا مۆرکراو، بەم جۆرە پەیمانی گڵاوی نهێنی (سایکس پیکۆ) لەدایک بوو، بەڵام بە زۆڵی!!

سەرەنجام بەرهەمی جەنگی یەکەمی جیهانی شوومی نێوان دەوڵەتە زلەکان ئەوەبوو کە میراتی پان و بەرینی ئیمپراطۆری عوسمانی و خەلافەتی ئیسلامی!! لەنێوان رووسیاو بەریتانیاو فەرەنساو ئیطالیادا بەشرایەوەو، کوردستانیش کە بەشێکی ئەو میراتە بەلاشە بوو ئاوا کرا بە خێرو خێرات و لەسەر سفرەو خوانی دەوڵەتە

زله پێشکەوتووخوازەکان ا دابەش کرا :
بەشی ڕۆژهەلاتی لە چوارچێوەی ئێران دا مایەوە، بەشەکەی دیکەشی کرایە دوو لەت، کوردستانی سەروو پاش سەرکەوتنی کەمالییەکان لەنێو دەولەتی نوێ ی تورکیادا مایەوە، کوردستانی خوارووش پاش بێنەوبەرەیەکی زۆر خرایە سەر عێراق و عێراقیش کەوتە ژێر ڕکێفی ئینگلیزەوە.

هەلبەتە پاش ئەو کەین و بەینە لە سالی (١٩٢٠) یش دا پەیمانی (سیڤەر) بە ئامادەبوونی دەستەیەک لە نوێنەرانی کورد بەستراو، لە بەشی سێیەمی لە ماددەی (٦٢ و ٦٤) دا بنیاتنانی کوردستانێکی سەربەخۆی پێشنیار کردو، دیارە گەلی کورد زۆریان دل پێ خۆش کرد ا

بەلام پاش کودەتا (انقلاب) ی کەمال ئەتاتۆرکی دژ بە ئیسلام و نەتەوەپەرست، لە سالی (١٩٢٣) دا پەیمانی (لۆزان) بەستراو هەموو ئەو بریارانەی کە لە پەیمانی سیڤەردا درابوون هەلوەشێنرانەوە ا

سەرەنجام وەک پێشتر گوتمان (کوردستان) ئەو سەرزەمینە فراوان و پێکەوە جۆشدراوو ئالقەبەندکراوەی کە لە دەریای ڕەشەوە هەتا کەنداو (خلیج) درێژدەبێتەوەو، یەک گەلی یەک ڕەگەزی (بێ شوانی) تێدا دەژی ئاوا دابەش کرا :
(٤٤٠/٠٠) کیلۆمەتری دووجای درا بە تورکیاو (١٩٠/٠٠٠) کیلۆمەتری دووجای درا بە ئێران و (١٠٥/٠٠) کیلۆمەتری دووجای درا بە عێراق !!

کەواتە :
(٠٠٠/٠٠٠/٢٩%) ی خاکی تورکیا ملکی کوردەو (٠٠٠/٠٠٠/١٢%) ی خاکی ئێران ملکی کوردەو، (٠٠٠/٠٠/٢٩%) ی خاکی عێراقیش ملکی کوردە ا (١)

وە شایانی باسە کە هەرکام لە ڕووسیا و سووریاش ئەندازەیەکیان لە خاکی کورد بۆخۆ دابریوە، بەلام :
(وَسَيَعْلَمُ الَّذِينَ ظَلَمُوا أَيَّ مُنْقَلَبٍ يَنْقَلِبُونَ) الشعراء / ٢٢٧ .

تێبینی: بۆ نووسینی ئەم لاباسە پشتم بەم سەرچاوانە بەستوە :
١- (کردو کردستان) واسیلی نیکیتین، وەرگێر محمد قاضی ص ٦٢٣ ـ ٦٢٥ .
٢- (کوردستان لە سالەکانی شەری یەکەمی جیهان دا) د. کەمال مەزهەر ئەحمەد، لە لاپەرە (١٥٧ تا ١٦٩) .
٣- (خەبات لە ڕێ ی کوردستان دا) نووسینی : ن. أ. خەلفین، وەرگێر : جەلال تەقی، لاپەرە (٥، ١٥) .

(١) تێبینی: ئەو ژمارانەی سەرەوە لە نامیلکەی (مەسەلەی کورد...) دا بەهەلە نووسراون، لێرەدا ڕاست کراونەتەوە، بڕوانە لاپەرە [٢٠، ٢١] .

بەڵێ خوێنەری بەڕێز !

پێویستە ئاگاداری ئەو مەسەلەیە بین کە باسکرانی کوردایەتی لەلایەن باباى کوردی پڵیشاوەوە فەرقی یەکجار زۆرە لە باسکرانی عارەبایەتیو تورکایەتیو فارسایەتیو .. چیو چییایەتی لـەلایەن ئەو گەلانەوە کە خاوەنی دەوڵەت و کیان و قەوارەی خۆیانن !

چونکە کورد کە دەڵێ کوردمو باسی کوردو کوردستانی دەکـات مەبەستی ئەوەیە کە بڵێ :

با وەک چۆن خەڵک هەیە منیش هەبمو نەپڵیشێمەوەو لەبەین نەچم !!

بەڵام باباى تورک کە لافی تورکایەتی لێدەدا مەبەستی ئەوەیە کە بەس بۆخۆی هەبێو کوردە دراوسێیەکانیشی بە تورکی شاخـاوی لەقەڵەم بدات ! هەروەها عارەبیش و فارسیش و هەر گەل و نەتەوە - یەکی خاوەن دەوڵەت و قەوارەو دەسەڵاتی دیکەش !!

جا بێگومان قسەی دوو کەس کە یەکیان دەڵێ: با منیش هەبم ! وە ئەوی دیکەیان دەڵێ: با بەس من هەبمو خەڵکی دیکە بەردەست و خزمەتکارو کۆیلەی من بێ، هێندەی ئاسمان و زەوی لێک دوورن .

ئەم ڕاستییەشم بۆیە خستەڕوو تاکو لە ناسینی واقیعـــی گەلەکەمان و تێگەیشتنی بارودۆخی نەفسیو سیاسیدا بەهـــەڵەدا نەچین و، لە ڕوانگەو گۆشەنیگای خەڵکی دیکەوە نەڕوانینە ئـــەو گەلە چەوساوەو بەشخوراوەو، خۆمان لە ئاوێنەی تێڕوانیــــن و بیرکردنەوەی خەڵکی دیکەدا نەبینین ، چونکە حەیفێ گەلێک بـــرا موسڵمانمان هەن ئاوا ڕەفتار دەکەن !!

بەڵێ بەگوێرەی یاسای فیزیایی:بۆ هەر کارێک کاردانەوەیـــەک هەیە، لە ئەندازەدا بارتەقایەتیو لە ئاڕاستەدا پێچەوانەیەتـــی ( لكل فعل رد فعل يساويه في المقدار ويعاكسه في الاتجـــاه ) ، گەلی کوردی بێبەش و ستەمدیدەو لەتوپەتکراوو نیشتمان زەوت

کراویش ، ئاڵای کوردایەتی هەڵگرت و، بەمەشەوە نەوەستاو پەنای بردە بەر چەندان ڕێچکەو بیردوزەی جۆراوجۆری ڕۆژهەڵاتی و ڕۆژئاوایی، بەشکم ئەوە خوایە دەفریای بێن و بە ئامانجی بگەیەنن و، لە ستەم و چەوساندنەوەو بێ قەوارەیی قوتاری بکەن !
بەڵام هەیهوو هەیهوو !!

کەواتە :

پوختەی مەبەست ئەوەیە کە کێشەو گیروگرفتی کورد بریتییە لە ستەملێکرانی و نیشتمان زەوت کرانی و مافی ڕەوای پێ شێل کرانی لەلایەن دەرو دراوسێیەکانییەوە، ڕوونتر بڵێم :
کاکڵی کێشەی کورد بریتییە لە ( مافی ژیان پێ ڕەوانەدیتران ) ی لەلایەن دراوسێ و برا مسوڵمانەکانییەوە !
( هەڵبەتە لەم قسانەدا ڕووی ڕەخنەو گلەیی لە دەستەڵاتدارو ڕێژمە بەدەستانی ئەو گەلە دراوسێیانەیە نەک خەڵکە بێچارەکە ).
خوێنەری بەڕێز !
ئێستا کە زانیمان کێشەو گیروگرفتی گەلی کورد چییەو چۆن پەیدابووە ؟ با بچینە سەر وەڵامدانەوەی پرسیاری دووەم :

دووەم : مەسەلەی کورد چۆن چارەسەر دەکرێ ؟!
چارەسەری کێشەی کورد لە ڕوانگەی ئیسلامەوە بەوەدەبێ کە کوردیش وەک هەموو گەل و نەتەوەکانی دیکەی جیهان گەلێکی ئازادو سەربەخۆ بێ و، لە نیشتمانی خۆی دا ئازاد بێ و هیچ کەس بە هیچ ناوو نیشانێکەوە ئاغایەتی و کوێخایەتی بەسەردا نەکات و مافە سروشتییە ڕەوایەکانی خۆی لێ زەوت نەکات !

کەواتە :

هەتا گەلی کوردی مسوڵمان بچەوسێنرێتەوەو، دراوسێیەکانی بە

کەمایەتی ( أقلیة ) و مسکێن و ژێردەست سەیری بکەن و، هەتا نیشتمانی کورد پارچەپارچە بێ و لە بازاڕی ڕەشی ئیمپریالیزمی جیهانخۆردا سەوداو مامڵەتی پێوەبکرێ و بەملاولا بفرۆشرێ، وە هەتا مافی قەوارە هەبوون و دەوڵەت هەبوون وەک هەموو گەلانی دیکەی دنیا بە کورد ڕەوا نەدیترێ و، هەتا کورد وەک منداڵی زڕ هەر جارە لەلایەن دراوسێیەکییەوە چەپۆکی بێ ڕەحمانەی پێدا بدرێ و دابپەڵۆسرێ! مانای وایە لە ڕوانگەی ئیسلامەوە کێشەو گیروگرفتی کورد هەر بەردەوامەو لەئارادایەو، بۆ گەلی کورد مافێکی یەکجار سروشتیو ڕەوایە کە هەرچی توانای هەیە بیخاتەکار، بۆ بوونی خۆسەلماندن و خۆقوتارکردن لە ژێرچەپۆکیو چەوساوەییو، وەدەست هێنانی ئازادیو سەربەخۆیی ڕەواو شەرعی!

بەڵێ خوێنەری بەڕێز!

با تۆش و هەموو کەسێکی دیکەش بزانێ کە ئێمەی ( ئیسلامی ) و شوێن کەوتووی ڕێبازی پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم بێ پێچوپەناو بە ڕاشکاوی دەڵێین:

چارەسەری مەسەلەی کورد لە ڕوانگەی ئیسلامەوە ئەوەیە کە کوردیش مادام وەک هەموو گەلانی دیکەی دنیا خاوەنی زمان و نیشتمانی تایبەتیو سەربەخۆی خۆیەتی، بە هیچ ڕەنگێک ڕەواو شەرعی نیە بکرێتە پاشکۆی گەلێکی دیکە، یان هاو وڵاتییەکی پلە دوو!!

چونکە چەندە عارەب عارەبەو تورک تورکەو ئینگلیز ئینگلیزە، هێندەی بێ کەموزیادیش کورد کوردە!

واتە نەتەوەی کوردیش لە نەتەوە ( شعب ) بوون دا هیچی لە نەتەوەکانی دیکە کەمتر نیە، دەی بۆچی دەبێ شتێک کە بە نەتەوەکانی دیکە ڕەوا بینراوە بەمیش ڕەوا نەبینرێ؟!

بەڵام خوێنەری سەنگین !

با تۆش و هەموو کەسێکی دیکەش بزانن ! کە ئێمە بەهیچ جۆرێک مەبەستمان لە خستنەرووی ئەم راستییە ئەوە نیە، کە ئوممەتی ئیسلامی بە بیانووی سەربەخۆیی نەتەوەکانەوە لەت وپەت بکەین !! ( هەرچەندە لەت وپەتیش کراوە ) !!

ئنجا دابین کردنی مافی گەلی کوردو هەر گەلێکی دیکەش بەشێوەیەکی ئیسلامی بەهیچ شێوەیەک سەرناکێشێ بۆ لەت وپەت کردنی نیشتمانی ئیسلامیو پەرتەوازەبوونی ئوممەتی پێغەمبەر صلی الله علیه وآله وسلم، چونکە ئەو ماف دابین کردن و ئازادیو سەربەخۆیی وەدەست هێنانە لە روانگەی ئیسلامەوە بە دوو شێوە مومکین دەبێ، (١) کە هیچ کامیان زیان بە یەکیەتی جیهانی ئیسلامیو ئوممەتی ئیسلامی ناگەیەنن :

١- ئەگەر بگونجێ دەوڵەتێکی بەرفراوانی ئیسلامی لەسەر ئاستی ئوممەتی ئیسلامیو نیشتمانی ئیسلامی پێک بێ، گەلی کورد بەشێکی ئەو ئوممەتەو نیشتمانەکەشی ناوچەیەک و ویلایەتێک بێ لەو نیشتمانە فراوانە .

٢- ئەگەر پێکهاتنی ئیمپراطۆرێکی فراوانی ئیسلامی مومکین نەبوو، هەروەک چۆن عارەبستان و تورکستان و ئەفغانستان و هیندستان ... هەن، با ( کوردستان ) یش هەبێو، ئاڵای ئیسلامی لەسەر بشەکێتەوە(٢)

(١) دیارە ئێمە بروامان وایە کە چارەسەری شەرعیو راستەقینەی کێشەی کورد دەبێ بە یەکێک لەم دوو شێوەیە بێ، بەڵام ویڕای ئەمەش بروامان بە پلەپلەیی (تدرج) یش هەیەو، مەرج نیە ئینسان بتوانێ یەکسەرەکان بە یەک قۆناغ بەئامانج بگات ! کەواتە هەر هەنگاوێک کە لە ئامانجمان نیزیک دەخاتەوە بە شتێکی پەسندو چاکی دەزانین، گرنگ ئەوەیە ئێمە هەقە شەرعییەکەو چارەسەرە راستەقینەییەکەمان هەر لەبەرچاو بێو لەبیرمان نەچێتەوە .

(٢) بێگومان کوردستان لە سەردەمی خەلافەتی ئیسلامیدا چ لەماوەی

ئنجا با بچینە سەر وەڵامدانەوەی پرسیاری سێیەم و کۆتایی :

سێیەم : مەسەلەی کورد بەچی چارەسەر دەکرێ ؟!

لەوەڵامدا دەڵێین :

لە ڕوانگەی ئێمەی ئیسلامی و پابەندی ڕێبازی پێغەمبەرەوە صلی الله علیه وسلم تاقە ڕێگەی بەئامانج گەیشتن و تاقە دەرمان و چارەسەری هەموو دەردو گیروگرفتێک تەنیا و تەنیا بەرنامەی خواو ڕێ و شوێنی ( محمد المصطفى ) یە صلى الله عليه وآله وسلم .

بەڵێ ئێمە بەهۆی گرتنی ڕێبازی پێغەمبەرەوە نەک تەنیا بە ئامانجی ڕزگاری و سەربەخۆیی دەگەین ، بەڵکو هەموو ئاوات و ئامانجێکی بەرزو پیرۆزی ماددی و مەعنەوی و دنیاو دواڕۆژان ... وەدەست دێنین ، چونکە ڕزگاربوون و بەمرادگەیشتنی گەلی چەوساوەی کوردو هەر گەلێکی دیکەی وەک ویش پەکی لەسەر سێ مەرجی سەرەکی کەوتوە ، کە بەهۆی گرتنی ڕێبازی پێغەمبەرەوە هەرسێکیان دێنەدی :

١- تێکۆشان ( الجهاد ) .

٢- لەسەر لاقی خۆ وەستان ( الأعتماد على الذات ) .

٣- یەکریزی و کۆڵ نەدان ( وحدة الصَّف والثَّبات ) .

بەڵێ ئیسلام وا لە شوێن کەوتووانی دەکات ، کە ژیان و مردن و مان و نەمانیان لەپێناوی خوادا بێت و لەپێناوی چەسپاندنی حوکمی خوادا هەموو شتێک بەخت دەکەن .

---

................................................................

چوار جێنشینەکان و چ ئەمەویەکان و چ عەبباسیەکان و چ عوسمانیەکان دا ، لەت وپەت نەکرابوو و کوردیش بەش بەش نەبووبوو بەڵکو نیشتمانی کورد دوای لێشاوی ئیمپریالیزمی ڕۆژئاوا و هێنانی بۆ سەر جیهانی ئیسلامی و بەتایبەتی دوای دابەشکرانی دەوڵەتی عوسمانی بەسەر دەوڵەتە زلەکان دا ، پارچەپارچە کراو بەشرایەوە . بڕوانە کتێبی :
( کیف هدمت الخلافة ؟ ) ص ٩٨ . عبدالقدیم زلوم .

وە وایان لێ دەکات کە بەهۆی پشت بەخوا بەستن ( التوكل على الله ) ەوە یەکجار پشت ئەستوور بن و زۆر متمانە بەخۆیان بکەن و خۆیان بە حەوجێی سواڵ و سەدەقەی ئەملاولا نەزانن !

وە وایان لێ دەکات کە دڵیان پێکەوە گرێ بدرێ و وەک چینی دیوارێکی پێکەوە جۆشدراوو مەحکەم یەکدی ڕاگیر بکەن و پشتی یەکتر بگرن، وە هەتا دواهەناسەی ژیانیان درێژە بە خەباتیان بدەن .

ئنجا لەکۆتایی ئەم باسەدا دوو قسەی کورت و گوشراوم هەن هیوادارم زۆر بەوردی سەرنج بدرێن :

١ـ با پەند لە ڕابردوو وەربگرین و چیدی ڕێ ی خوارو خێچ و سەرگەردان کەر بەرەو ئامانجی شەرعیو ڕەوامان نەگرینەبەر ،چونکە بەم ڕەفتارەمان سەربارى بەئامانج نەگەیشتن و ڕەنجبەخەسارچوون، خەڵکیش لە خۆمان گوماندار دەکەین و ( نائیسلامی ) خۆمانیان بە زمانی حاڵ بۆ ئیسپات دەکەین ! گوتراویشە :

( مَنْ جَرَّبَ المُجَرَّبَ حَلَّتْ بِهِ النَّدامَةَ ) .

٢ـ ئیسلامی نەک ئیستیسلامی !

بەڵێ ئێمە کە هێندە تەئکید لەسەر ( ئیسلامی ) بوون دەکەین ، نابێ هیچ کەس بەهەڵە ( ئیسلامی ) ئێمە بەو ( ئیستیسلامی ) یە تێ بگات کە لەملاولا لە هەندێک پێرو کۆمەڵی هەرچیوپەرچی و هەلپەرست و بەرژەوەند دۆستدا دەبینرێ !

( ئیستیسلامی) بوونیش سێ شێوەی هەن :

١ـ لەبواری عەسکەری دا ، کە بە یەکجاری یەک چەک فڕێ دەدەن و بەبێ تەقەو دەستکردنەوە خۆ بەدەستەوە دەدەن !!

٢ـ لەبواری سیاسیدا ، کە لەکوێ وە ( با ) ی چاکی بێ شەنەی دەکەنو هەر جارە ڕوو لە قیبلەیەک دەکەن و ، جڵەوی خۆیان وەدەست هەموو کەس دەدەن .

٣ـ لەبواری ئیتری دا ، کە بۆخۆیان هیچ نەخشەو بەرنامەیەکیان نیەو، وەک هەوبرو قوڕی صەناعەوان، شکڵ و قاڵبی ئەو دەستە وەردەگرن کەلەدەستیان دەگرێ و، وەک ئەشکەوتێک وان هەر دەنگێکی بێ بیستن وەک خۆی عەکسی دەکەنەوە .

بەڵێ (ئیسلامی) ، نەک ( ئیستیسلامی) جا هەر جۆرێکی بێ و لەهەر قاڵب و شێوەیەک دا بێ و، لە بەرانبەر هەر شتێک و هەرکەسێک و هەر لایەنێک دا بێ !!

تێبینی :

ئەم قسانەم مەبەستم پێی گوزەرو گۆشەیەکی دیاریکراو نیە ، بەڵکو هەر گوزەرو بوون و ئەکەرلەشتێکی هەرلایەنێکی بەناوی ئیسلام و لەژێر دروشمی ئیسلام دا کاربکات و ، لای [ئیسلامی] بوون لێ بداتەوە ، هەروەها یان هەندێک لە هەڵسوکەوت و نیشانەکانی تێدان کە باسم کردن ، ئەوە بەئەندازەی زۆری و کەمی ئەو هەڵسوکەوت و نیشانانەیە [ئیستیسلامی] لەقەڵەم دەدرێ ، ئەگەر لەزمانی لوسی دا هەریەسوعێ و ، لەخواپەرستی و تەقوای پەرلەمانی و لاکانی دا سۆفیەکی (پاسپوریتێ) ئاسا بێت و ، یا هەموو قورئانیشی لەسینگی دابێ و ، هەرچەندە کێشی کەواو سەلتەو عەبایەو شاڵی باتمانێکیشی بێ !!

چونکە ئیسلامی بوون لەسەر بوونەوەری هێشووەی ئیزی پاک و لەگەڵ خواو ستۆکشانەوە پێوەندی زۆر پاکی دا بوونی خۆی دەسەلمێنێ نەک لەبواری زمانی لوسی و پابانی و جامانی داو لە تاڵوی قەوزەیانەوە دیمەنەی پەرلەمانی دا .

## باسی هەشتەم

# ڕەواندنەوەی تەمومژی بۆچوونێکی هەڵە

هەندێک کەس هەر کە باسی ئیسلامەت بۆکردن دەڵێن :

کاکە گیان !

مەسەلەی ئێمەی کورد مەسەلەی ئایین و ئیسلامەتی نیە ، چونکە ئێمە لەڕووی ئیسلامەتی‌یەوە ناچەوسێینەوە ، بەڵکو لەڕووی نەتەوایەتی‌یەوە دەچەوسێینەوە ، بە واتایەکی دیکە :

ئێمە وەک کوردێک دەچەوسێنرێینەوە ، نەک وەک مسوڵمانێک ، کەواتە دەبێ شۆڕش و خەباتەکەمان لەسەر بنچینەی ( کوردایەتی ) بێ نەک ( ئیسلامەتی ) !!

ئێمەش لەوەڵامدا دەڵێین :

١- لەڕاستی‌دا ئەم قسانە زادەو هەڵقوڵاوی عەقڵی کەسێکن کە لە ئیسلام حاڵی نەبووەو ، پێی وایە کە مسوڵمانەتی بەس بریتیە لە بەڕێوەبردنی چەند درووشمێکی مەعنەوی‌و چەند هەڵس وکەوتێکی شەخسی !! دەنا دەبوو زانیبای کە چەوساندنەوەی تاقە ئینسانێک نەک نەتەوەیەکێ ! کارێکی بێ شەرعی‌و نائیسلامی‌یەو دەبێ مسوڵمانان دژی بوەستن چونکە ئیسلام دژی یەتی .

٢- لە ڕوانگەی ئیسلامەوە هیچ جیاوازی نیە لەنێوان ئەوەدا کە نەیەڵن باباپەکی کورد نوێژێ بکات ، یان نەیەڵن لە خاکی خۆی دا بەئازادی بژی‌و بەرگ و پۆشاکی خۆی دەبەر بکات و بە زمانی خۆی بدوێ ، چونکە هەروەک چۆن نوێژکردن فەرمانی خوای لەسەرە ، ئازادی‌و سەربەخۆیی هەر ئینسانێک و هەر گەلێکیش فەرمانی خوای لەسەرە !

خوداش لە قورئانیدا فوتارپوون لە دەروی سەختی قیامەتی بە چەند شتێکەوە بەستۆتەوە کە یەکەمیان ئازادکردنی ئینسانێکە چ جای گەلێک ! لە ژێرنیری کۆیلایەتی: ( فَلا اقْتَحَمَ العَقَبَةَ . وما أدراكَ ما العَقَبَةُ ؟ فَكُّ رَقَبَةٍ . أو إطْعامٌ في يَوْمٍ ذي مَسْغَبَةٍ .... ) البلد/ ١١،١٢،١٣،١٤ .

٣- ئەگەر سەرنجی مێژووی ئەو گەلانە بدەین کە درووشمی نەتەوەپەرستی - یان بەرزکردۆتەوە، دەبینین یان بە ئامانج نەگەیشتوون، - بۆ وێنە عارەب و کێشەی فەلەستین - یان ئەگەر بەرواڵەت بە ئامانجیش گەیبن بوونە میکرۆبێکی پیس لە ناوچەکەدا، وەک تورکە کەمالیەکان و (1) عارەبە بەعسیەکان.



(١) بۆ ئەوەی بزانی بیری ناسیۆنالیزمی تورکی کە لە کەمال ئەتاتورک و دەستەو دابەرەکەی دا خۆی دەنواند، چی بەسەر گەلی کوردمان هێناوە بروانە کتێبی : ( چەند لاپەرەیەک لە مێژووی گەلی کورد ) نووسینی: د. کەمال مەزهەر ئەحمەد، لاپەرە (٦٧ تا ٨٨) .
دیارە رەفتاری بەعسیەکانیش هێندە زەقە حەوجێی بە باسکردنی نیە، هەرچەندە ئێمە لە پێناسەی حیزبی بەعسدا تۆزێکمان باس کردوە .

# لەکۆتایی دا

# چەند قسەیەکی کورت و پوخت لەگەڵ گەلی کوردی خۆشەویست دا

خوێنەری خۆشەویستم !

ئەگەر بەوردی سەرنج بدەینە گەلی کوردمان دەبینین لەم سەردەمەدا بۆتە چوار بەش :

١- ئیسلامی‌یەو بڕوای بە تێکۆشان و خەباتی چەکداری هەیەو بەشێوەیەک لە شێوەکانی تێکۆشان ( جهاد ) خەبات دەکات و، ئەوەندی لەدەستی بێ ڕەنج دەدات .

٢- ئیسلامی‌یەو بەڵام ئامادەی تێکۆشانی چەکدارانە نیە، جا بڕوای پێی بێ یان نا .

٣- مسوڵمانە بەڵام ئیسلامی نیەو پەنای بردۆتە بەر یەکێک یان پتر لە ڕێچکەو بیردۆزەکان و دژی ئەو ڕژێمەشە کە گەلەکەی دەچەوسێنێتەوە، جا خەبات بکات یان نا .

٤- بەرواڵەت مسوڵمانە ( بەڵام نەک هەر ئیسلامی نیە بەڵکو وابەستە یان دابەستەی ڕژێمەو، بە شێوەیەک لە شێوەکانی خزمەت و هاوکاری کردن لە خزمەت ڕژێم دایە، وەک سەربازی بۆکردن، جاشەتی، سیخوڕی و جاسووسی، فتوا بۆدان و دووعا بۆکردن و خەڵک بۆ کەرکردن ( الأستحمار ) !!

جا ئەوە چەند قسەیەکی کورت و پوخت بۆ عوزرو بەهانە نەهێشتن و ( إتمامُ الحجّة ) ، لەگەڵ هەرکام لەم چوار کۆمەڵەدا دەکەم :

یەکەم :

ئیسلامی یانی تێکۆشەر !

کەڵەپیاوانی هەڵمەتبەر !

فیداکارانی نێو سەنگەر !

ئاگاداربن !

١- با ناوو نێوەڕۆکتان یەک بێ !

٢- بەڵگەی ڕاستیی ئیسلام بن لەسەر خەڵکی، نەک بەڵگەی دەستی خەڵکی بن لەسەر ناتەواوی ی ئیسلام !

٣- بەس خواتان مەبەست بێ، خواپەرست و ڕەوشت بەرز بن، براو تەبا بن، مەردو ئازا بن، زیرەک و وریا بن !

دووەم :

ئیسلامی یانی بێ مشوور !

مسوڵمانانی بێ چەک !

ئەی ئەوانەی خۆتان بە مسوڵمان دەزانن بەڵام لە گەورەترین درووشم و ڕەوشتی پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم دەڕەونەوە کە چەک هەڵگرتن و سەنگەر گرتنە !

وە ئەی ئەوانەی کە خۆتان بە ئیسلامی دەزانن بەڵام دەرهەق بە گەلە بێ کەسەکەتان بێ مشوورو کەمتەرخەمن !

زۆر چاک بزانن !

١- ئیسلام ئەگەر بە زەبری هێزو چەک و ئارەق و خوێن نەبا نە یەکەم ڕۆژ دەڕسقا و خۆی دادەکوتا ، وە نە لە دوایی‌دا خۆی ڕادەگرت و لەبەردەم گێژەڵووکەی دوژمنان دا دەما !

٢- هەرکەسێک خەم لە خەڵکی نەخوات بە ئیسلامی دانانرێ ؛ ( مَنْ أَصْبَحَ لایهتمّ للمُسلمينَ فَلَيْسَ مِنْهُمْ ) رواهُ الحاكم .

وە هەرکەسێک بەشداری ئێش و ژانی گەلەکەی نەکات، یەکەم سپڵەو بێ نمەکەو، دووەم کەسیش ئیعتیباری پێ ناکاو گوێی پێ نادات!

٣- بە بەهانەی پەروەردەکردنی خەڵکی پشت لە جیهاد مەکەن، چونکە یەکەم: بابی دەست پێکردنی جیهاد خەڵکمان هەیەو پێغەمبەریش صلى الله عليه وآله وسلم بە ژمارەیەکی کەم دەست بەکار بوو!

دووەم: مەیدان و زەمینەی ڕاستەقینەی پەروەردەکردن و پاڵاوتنی خەڵک گەرمەی جەنگ و جیهادە، (وَلِيُمَحِّصَ اللَّهُ الَّذِينَ آمَنُوا..) آل عمران-١٤١-

سێیەم: ئەسپێک کە بە چل ساڵی تەعلیم بدرێ، دەبێ لە مەیدانی قیامەتێدا بەکار بێ!

سێیەم:

نائیسلامی یانی مسوڵمان!

چەکدارانی بێ قورئان!

برادەران!

ئەی ئەوانەی خۆتان بە مسوڵمان دەزانن، بەڵام پێتان شوورەییەو نەنگە ناوی ئیسلام بهێنن و خەت و ڕێبازی پێغەمبەرە-کەتان بگرن!

وە ئەی ئەوانەی چەکی ماددیتان لەشانە بەڵام حەوجێتان بە قورئانە!

بێدار ببنەوەو بزانن! کە:

١- مسوڵمان دەبێ بەس ئیسلامی بێ، نە لیبرالی، نە دیموکراتی، نە ناسیۆنالیست، نە کۆمۆنیست! چونکە مسوڵمانەتی ناوی بێ نێوەڕۆک و عیبادەتی بێ سیاسەت نییە!

٢- ئیسلام بەرنامەی سەرلەبەری ژینەو، دەبێ هەروەک چۆن نوێژەکەتان

– هەرچەندە کەمیشتان دەیکات ! – بەپێی شەرع و پەیڕەوی خـوا و پێغەمبەرە صلی الله علیه وسلم، خەبات و تێکۆشانیشتان هـەر بەپێی ئەو پەیڕەوە بێ، هەڵبەتە شۆڕشی بێ تەقواش شەوەڕەشـە، هەروەک چۆن تەقوای بێ تەقەش نیشانەی بێ جەوهـەری و کەودەنییەکی زەقە !

٣– ئەو ڕێچکەو بیردۆزانەی تا ئێستا پەنایان پێ بردوون و، ئەو قیبلانەی تا ئێستا ڕووتان تێ کردوون، ئەوە هیچ کە دادیان نەداون بگرە ساڵ بۆ ساڵێ و جار بۆ جارێ پتریان شپرزەو شەپڕێو کردوون و، زیاتریشیان وەدواخستوون، کەواتە بەدەردی پێشینان دەڵێن : ( بە بۆنی کەبابی یەوە چووبووْ، بەڵام دوایی دەرکەوت کـە کەر داغکردن بوو ! ) .(١)

---

(١) ڕەنگە هەندێک بگرە زۆر لە برادەرانی مسوڵمانی نائیسلامی ! دڵیان بەم پەندە کوردی یە بێشێ، بەڵام ئومێدەوارم کە دڵیـان لەوە بەهێزترو عەقڵیان لەوە بەپێزتر بێ کە بە قسەی راسـت و واقیعی گۆمی هەست و نەستیان بشڵەقێ، ئنجا با ئەم ڕاستی یانـەش لەبەرچاو بگرین :

یەک : ئێمە وەک کەسانێکی ئیسلامی برادەرانی شوێن کەوتووی ڕێچکـان بە مسوڵمان و بە ئەهلی قیبلەو ئوممەتی پێغەمبەر صلی اللّه علیه وسلم لەقەڵەم دەدەین، هەتا کوفری بێ پێچوپەنایان لێ دەبینین، وەک بەدرۆ ناڕاست زانینی یەکێک لە یاسا ئاشکرایەکانی ئیسلام، یان بە زاراوی زانایانی ( اصول الفقه ) " اِنکارُ ما عُلِمَ مِـنَ الدّینِ بالضّرورە " .

دوو : ئێمە بێ ویژدانانە سەیری واقیعی جموجۆڵ و کارکردن و ڕەنـج دان و خەباتی ئەو برادەرانە ناکەین، بەڵکو دانی پێدا دێنین کە بەڕاستی ئازاو بەجەرگ و ئیشکەرو لێبراو بووون و، بەپێی ئـەو ڕێچکەو بیردۆزانەی کە پێیان بەرێوە چوون، تێکۆشانی چاکیـان لەپێناوی ڕزگاری گەلەکەیان دا ئەنجامداوە .

هەڵبەتە ئێمەش وەک ( ئیسلامی ) لەسەر عەینی خەبات و تێکۆشان و کارکردنەکەیان سوپاسیان دەکەین، بەمەرجێک چاوپۆشی لە ڕێچکـەو بیردۆزەکانیان بکەین و، هەندێکیشیان لێ هەڵاوێرین و جیاوەکەین !

سێ: ئەو برادەرانە زۆربەی هەرەزۆریان ئامانجو مەبەستیان بەس خزمەتکردن و رزگاری و ئازادی گەلەکەیان بووە، بەلام هەشیانە رزگاری و ئازادی گەلی کردۆتە کراسی عوسمان بۆ مەبەستێکی دیکە، ئنجا بێگومان ئێمە بە دوو چاوی زۆر لێک جودا تەماشای ئەو دوو جۆرە برادەرانە دەکەین و هەر یەکەیان حسابێکی سەربەخۆی بۆ دەکەین!

چوار: بەلام لەگەل پێ لێنان (اعتراف) مان بە دلسۆزی و نیاز چاکیو لێهاتوویی و فیداکاری زۆربەی هەرەزۆری ئەو برادەرانەدا قەناعەتی تەواویشمان لەوەدا هەیە، کە هەموو ئەو دەستەواژە (وسيلة) و رێ یانەی ئەو برادەرانە دەستیان بۆ بردوون و رەچاویان کردوون، بۆ گەیشتن بەو ئامانج (هدف) ە بەرزو ئیسلامیيەی کە بە هیوای وەدەستهێنانی بوون، (واتە رزگاری و ئازادی گەل و پەیدابوونی کیان و قەوارە)، بەلێ دلنیاو مسۆگەرین کە هەموو ئەو وەسیلەو رێ یانە هەر لە ناسیۆنالیزمو لیبرالیزمەوە بیگرە هەتا دیموکراتیو هەموو جۆرو شێوەکانی کۆمۆنیزمو مارکسیزم، سەرلەبەریان کوێرە رێ و پردی پچراون و، بۆن چرووکێکی بە کەباب حسێب کراون، ئەوەش کە ئەو قەناعەتەی بۆ درۆست کردووین بەدگومانی (سوء الظن) نیە، بەلکو واقیع و پەرێزو بەرهەمێکی بەرچاوە.

تێبینی:

هەرچەندە ئێمە لێرەدا بەگشتی دەربارەی شوێنکەوتووانی ڕێچکەکان دەدوێین بەڵام گومانی تێدا نیە، کە لەنێوان ڕێچکەکانیشدا جیاوازی زۆر هەیەو بە شتێکی دادگەرانەو ڕاستی نازانین هەموویان بە یەک چاو سەیر بکرێنەو وەک یەک حەشر بکرێن.

چوارەم:
بەناو مسوڵمانانی خۆفرۆش!
وابەستەو دابەستانی بێ هۆش!
بێدار ببنەوەو لە کەری شەیتانی دابەزن، بەرلەوەی لەبەر دادگای خوادا لە سامو حەژمەتان بلەرزن و پەنجەی پەشیمانی بگەزن!
وە بشزانن!
١- هەرکەسێک ڕچەی کۆمەڵێک بگرێ، یان ئاپوراییو ژمارەیان زۆربکات حیسابی وانی بۆ دەکرێ وەک پێغەمبەرمان صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (مَنْ تَشَبَّهَ بِقَوْمٍ فَهُوَ مِنْهُمْ) رواه احمد وابوداود والطبرانی وصَحَّحه العراقی وابن حبان.
وە فەرموویەتی: (مَنْ كَثَّرَ سَوادَ قَوْمٍ فَهُوَ مِنْهُمْ) رواه ابویعلی والدیلمی.
٢- لە دنیادا لەگەڵ کێدا بن و سەر بە چ دەستەو پێڕێک بن، لە دواڕۆژیشدا هەر ڕەگەڵ وان دەخرێن و لەسەر ئایینی وان حەشر دەکرێن، وەک خودا فەرموویەتی: (اُحْشُرُوا الَّذِينَ ظَلَمُوا وَأَزْواجَهُمْ ..) الصافات/ ٢٢.
توێژەرەوان فەرموویانە: (أَزْواجَهُمْ: أَصْنافَهُمْ وَأَشْكالَهُمْ).
وە رابەرمان رووحم فیدای بێ فەرموویەتی: (الرَّجُلُ عَلى دِينِ خَلِيلِهِ فَلْيَنْظُرْ أَحَدُكُمْ مَنْ يُخالِلْ) رواه الترمذی وحسنه.
دەجا هیچ گومانی تێدا نیە کە مەسیحی وەک عەفلەق و جوولەکەی وەک مارکس و مونافیقی وەک صەددام، جێگەیان تەنیا دۆزەخە.
٣- ئەو ڕژێمە کافرو زۆردارو غەددارەی کە خزمەتی دەکەن و سیخوڕیو خیانەتی بۆ دەکەن، یان بۆی دەبنە جاش و سەربازو بەرگری لێ دەکەن، یان ئۆباڵی بەناهەقی بۆ دەکێشن و فتوای ناڕاستی بۆ

دەدەن و قسەو ڕەفتارە نالەرعی‌یەکانی بۆ ڕەشەرع دەخەن و، لەسەر مینبەری پێغەمبەرو میحرابی خواپەرستیدا بێ شەرمانە دووعـــای بۆ دەکەن و، داوای ڕاوەستاوی و پارێزران و تەمەن درێژی بۆ لـە خوا دەکەن، وەفاو ئەمەگی بۆ هیچ کەس نییەو، ئێوە بـــەم ڕەفتارانەتان سەربار ی سەرشۆڕی و ڕووڕەشی لای خواو خەڵکـــی، وەک ئەو کەسەش وان کە بە دەستی خۆی پەتی پێ خنکێنرانی خـــۆی دەهۆنێتەوەو، مارو سەگی هار لە ماڵێ خۆی دا پەروەردە دەکـــاو دەبەستێتەوە !!

هیواداریشم هەر چوار بەشی گەلەکەم ئەم ئاگـــاداری و ئامۆژگاری یانە لەگوێ بگرن و زۆر چاکیان لێ ورد ببنـــەوەو تێفکرن !

إِنْ أُرِيدُ إِلَّا الْإِصْلَاحَ مَا اسْتَطَعْتُ وَمَا تَوْفِيقِي إِلَّا بِاللَّهِ عَلَيْهِ تَوَكَّلْتُ وَإِلَيْهِ أُنِيبُ .

٢١ / شوال / ١٤٠٩ ک

بەشە کوردستانی سەر بە عێراق / قوولە هەرمێ

بنکەی هێزی هەمزە رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ

# فەرهەنگیلەی ئەم ئاڵقەیە

| | |
|---|---|
| ئێرەیی | حەسوودی |
| بێ بنەچەکە | بێ ئەسڵ و فەسڵ ، ناڕەسەن |
| بیچم | شێوە ، دیمەن |
| بێزاندن | لەبەرچاوخستن |
| بریسکە بریسک | بریقە بریق ، تریسکە تریسک درەوشانەوە |
| پرۆلیتاریا | چینی کرێکار ، چینی زەحمەتکێش |
| بەرگری لێ کردن | لەسەرکردنەوە ، ( دفاع ) |
| پێشگیری لێ کردن | نەهێشتن ، ( منع ) |
| تاقیگە | ئەزموونگە ، ( مختبر ) |
| تێک هەڵپرژان | تێک هەڵقژان ، دەبەرێک ڕاچوون ، دەستەو یەخەی یەکدی بوون |
| تەپلۆس | تەوەزەل ، تەنبەڵ ، قالبگران |
| توێژاڵ | توێلکی تەنکی سەرەوەی شت |
| تێک هەڵدەنگوون | لەڕاستێک ڕا دین ، تێک دەگیرێن |
| جینگڵ دان | خۆبزواندن ، جووڵان |
| چەپاڵەی دا | پاراستی ، پەنای دا |
| چخورد | جەنگەڵی چڕوپڕ ، بیشەڵێن |
| خۆی ڕێک بێنێ | خۆی کوشمەڵە بکات ، خۆی گچکە بکاتەوە |
| پێگیری کردن | پێ داگرتن لەسەر شتێک ، ( تأکید ) |

| | |
|---|---|
| درێشه | ئاسنۆکەیەکی نووک تیژە کلکێکی داری پێوەیە ، پینەچی بۆ کونکردنی پێڵاوو چەرم‌و شتی دیکەش بەکاری دێنێ . |
| ڵسڵەو پڵپڵە | شتی زریق و بریق و سەرنج ڕاکێش‌و بەخرینگە . |
| قم لێ خۆش کردن | ددان لێ سوین ، خۆ بۆ ئامادەکردن |
| کاکەو برالەی خۆیان کرد | لەنێو خۆیان دا ڕێک کەوتن ، کەین و بەینی خۆیان کرد |
| کوان | دوومەڵ |
| کەودەن | نەفام ، بێ عەقڵ |
| کرکاتی لەخۆ بڕی | بێ دەنگ بوو ، بێ هەست بوو |
| خۆگنخاندن | خۆگرخاندن ، خۆمەحتەل کردن ، خۆ دواخستن بەبێ هۆ |
| لەگرێ ژەنە چوو | لەبەرێک هەڵوەشا ، لەبەرێک ترازا ، لە بنەڕەت دا ( گرێ موژانە ) ی نیرو ئاموور ( هەوجار ) بووە . |
| لێی دەپشکوێتەوە | لێی ڕوودەدات ، خراپەی لێ پشکووتەوە : خراپەی لێ ڕوودا . |
| مەدارکردن | ساچاندن ، هەڵکردن ، ژیان بەسەربردن |
| هەڵکردن | مەدارکردن ... |
| هەڵایساندن | داگیرساندن |
| هەتلەبوون | ڕێ ون کردن ، لاڕێ بوون |
| هەڵکشیوتر | بەرزتر ، بالاتر |
| هەڵداوپێدایی | بەرزی و نزمی |
| هەڵهێنجان | هەڵگۆستن ، دەرهێنانی ئاو یان هەر شلەیەکی دیکە لە بیرو چاڵ و هەر شوێنێکی دیکەی نزم . |

| | |
|---|---|
| ویچواندن | تشبیه |
| وەڕەزبوون | بێ تاقەت بوون ، حەوسەڵە نەمان |
| وەتحەسێنێ | بتحەسێنێتەوە ، ئاسوودەت بکات . |
| یەخسیرکردن | بەدیل گرتن ، ئەسیرکردن |

تێ بینی :

بۆ زانینی مانای هەر وشەیەکی دیکەی گران ، خوێنەرانی بەڕێز حەواڵەی کتێبی ( پوختەیەک دەربارەی ئیسلام ) و بەرگی یەکەمی ( دەبەرێک ڕاچوونی ئیسلام و ڕێچکان ) دەکەین .

# کاکلی باسەکان

